## ناوەڕۆک (پێڕست)

# پێشەکی

إنَّ الْحَمْدَ لِلهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِىَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ} (آل عمران:102)

{يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا} (النساء:1)

لە باسی ئەم نامیلکەدا، گەشتێک دەکەین بەناو قورئان و حدیث و وڵاتانی غەیرە ئیسلامی، کەوا چ دەگوزەرێت لەم بارەوە. ئامانجی ئێمە لەم نامیلکە ئەوەیە، کەوا خوشکانی خۆمان ئاگادار بکەینەوە، لە کارەساتی سفوری، کە ئایا سفوری خۆشیە؟ پێشکەوتنە؟ سەقافەتە؟ یاخود پێچەوانەکەیەتی.

بۆیە بە ئەرکێکی سەرشانمان زانی لەم بارەوە یارمەتی خوشکان بدەین نەک تەنیا موسڵمان! بەڵکو ئافرەتی غەیرە موسڵمانیش، چوونکە زۆرێک لە ئافرەتان هەڵخەڵەتێنراون لە لایەن پیاوانەوە، ئەویش تەنیا بۆ حەزی پیاو! بۆیە لەم بارەوە ئەمانەوێت ئافرەتی کورد نەبێتە کاڵا، وەک ئافرەتانی دەرەوە، کەوا شێوەی ئافرەت لە توالێت دانراوە بۆ ئەوەی پیسایی تیا بکەی! فرۆشگا دانراوە لەگەڵ تایبەتمەندی، یەک لەوانە ئەوەیە ئافرەت بە پارە ئەهێنێت پیسایی دەرخوارد دەدەی! ئەگەر لەبەر حورمەتی ئێوە نەبوایە وێنەکانم دا ئەنان! ئافرەت بۆتە کاڵا بۆ مەرامی پیاو، ئافرەتیش بە تەبیعاتی حاڵ، زۆرتر کاریگەر دەبن بە لایەنە سۆزدارییەکان لە لایەن رەگەزی بەرامبەرەوە.

بەو هیوای ئەوەی ئافرەتان، چاو کراوەبن لەم بارەوە هەڵنەخەڵەتێنرێن بەناوی مافی ئافرەتان (فێمینیزم) یان بە بیانوی ئازادی (لیبرالیزم) یان بە ناوی سەیر سەیری تر. ئافرەتانمان دەست بکەن بە عیلمەوە ئاستیان بەرەو پێش ببەن، کوردستانی خۆمان بگەینینە لوتکە.

لە کۆتاییدا یەک داواکاریمان لە خوشکان هەیە، ئەویش ئەوەیە کەوا لەکاتی خوێندنەوەی ئەم نامیلکە بە دڵێکی کراوە و مێشکێکی کراوە بیخوێننەوە.

١٣/شعبان/١٤٤٤

٢٠٢٣/٥/٣

ستافی ( H.A.D.I.T._ ) لە ئینستەگرام



# بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

## (ئاشتی و ڕەحمەتی الله وەک لێزمەی باران برژێت بەسەرتاندا)

**الله سبحانه وتعالى دەفەرموێتن:**

**يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ (الأعراف: ٢٦)**

ئەی نەوەی ئادەم بێگومان پۆشاکمان پۆشاکمان بۆ ناردوون کە عەیب و عەورەتتان دادەپۆشێ وە پۆشاکی جوان و ڕازاوەیش(مان بۆ ناردوون) بەڵام پۆشاکی ترسان لە خوا و پارێزگاری چاکتر و باشترە ئەوەی باسکرا هەندێکە لە بەڵگەو نیشانەکانی خوا بۆ ئەوەی بیربکەنەوە و ئامۆژگاری وەرگرن.

خوشکی من تکایە تۆزێک بوەستە...

بیر لە ژیانت بکەوە... لەرابردووت، لە ئێستات، بیربکەوە ئایا هێشتا دەستت کردووە بە جێبەجێکردنی فەرمانی خوای گەورە!

بەڵێ خوشکان وەک الله سبحانه وتعالى دەفەرموێتن: پۆشاکێک لەبەر بکەن کەوا عەیب و عەورەتتان دا بپۆشێت، لە کوردستانی خۆماندا، الحمد لله تا پێش هاتنی ئەم عەلمانیانە، خوشکان بە شێوەیەکی ڕێکووپێک خۆیان دادەپۆشت، وەک دایە گەورەی زۆرێکمان، پێی بڵێیت وەرە ئەم پانتۆڕە لەبەر بکە چیت بوێت بۆت دەکەم، زۆر جار وەڵامی زۆر رەق دەدەنەوە! باشە بۆ؟ لە وەڵامدا ئەڵێین ئەوان کەسانی خاوەن ئەزموون و بە یەقینەوە کەلامی الله سبحانه وتعالى لە دڵیان چەسپاوە، هەتا لەسەر بشکوژرێن ئامادە نین چۆک دابدەن بۆ بەناو مافی ئافرەتێک، کەوا گشت

ئەندامەکانیان چەند مێردێکی کـردووە و داوێـن  پیسـە و نەخۆشـە! ئەیەوێـت پـارە پەیا بکات بە جولاندنی هەستی ئافرەتی کوردی موسڵمان.

وەک لامان ڕوونە کەوا ئافرەت لە پەراسـووی چەپـی بـاوکە ( ئـادەم- سـەلامی الـلە لەسەربێت)  دروست بووە.

ئافرەت وەک پێشەوا و مامۆستا و خۆشەویستی دڵان  پێغەمـبەر (ﷺ) خۆمـان و دایـک و باوکمان بە قوربانی بێت، لە فەرموودەیەک ئەفەرموێتن: بە نەرمـی مـامەڵە لەگەڵ ئـافرەت بـکەن، ئافرەتـان لە پەراسـوەکی نوشـتاوە دروسـتبوون،پێچترین بەشـی پەراسوو سەرەکەیەتی، بۆیە بە نەرمی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن.

سەروەری نازدار چۆن بە جوانی وەسفی کردووە ئەگەر کەمێک تێی را بمێنین.

خوشکانی من، ئێمە شانازی بە موسڵمان بوونمان دەکەین، دڵنیـام کەوا هـاوڕان لەم بابەتەدا.

وە لە خوای گەورە دەترسین رەحممان پێبکات و لەو کەسانە بین کەوا اللـە سـبحانە وتعـالی بە بەهەشـتی خـۆی شـادمان کـات، ئـێمە ئەڵێـین موسـڵمانین وایە؟ باشـە وشەی موسڵمان واتای چییە؟ واتا ئێمە تەسلیمین بە کەلامی اللە سـبحانە وتعـالی. باشە ئەم قسەیە ئەکەیـن ئەی بـۆچی حیجـاب نـاکەین؟ ئەی ئـێمە نـاڵێین لە خـودا دەترسـین و خۆشـمان دەوێـت، اللـە سـبحانە وتعـالی پێمـان دەفەرمـوێتن خۆتـان داپۆشن ئێمەش دەبێت بڵێین سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا (گوێمان گرتوو ئەنجامی ئەدەین ).

## زۆرێک لە خوشکان عوزریان هەیە بۆچیٚ حیجاب (پۆشتە) ناکەن، لەوانە:

1. لەوانەیە زۆرێک لە خوشکان ئەو قسەیە بکەن کەوا حیجاب دەبێتە رێگری لە زانست وەرگرتن و پێشکەوتن با سەیرێکی توێژینەوەکان بکەین بزانین ئایا راستە ئەمە؟

قوتابی شانزە مونیر بە رەگەز پاکستانیە موسڵمانە یەک لە گرنگترین داهێنانی کردووە ئەویش داهێنانی پێڵاوی زیرەک بۆ ئەو کەسانەی توانای بینینیان لەدەست داوە!

لە شانشینی یەکگرتووی بەریتانیادا (یونایتید کینگدۆمدا) ٤ موسڵمان گەشتوونە تۆپ ١٠ لەسەر ئاستی ئەم وڵاتە، موسڵمانەکان بەم شێوە لەم تۆپ ١٠ دیارن (لەوانە کچە موسڵمان بە ناوی تەوحید اسلام پلەی یەکەمی وەرگرتووە لەسەر ئاستی ئەم وڵاتە! وە پلەکانی تر ٤،٦،١٠)

بەڵیٚ ئەمە ئاستی موسڵمانە بەڵام بەداخەوە دەزگاکان ئەمە دەشارنەوە لە کوردستان تاکو خەڵک جاهیل و نەزانبێت بێت!

2. یەکێک لە بیانوەکان ئەوەیە کەوا، ئەڵێت بڕوام بە حیجاب هەیە بەڵام دایکم رێگرە، ئەترسم قسەی دایکم بشکێنم گوناهباربم!

الله سبحانه وتعالى دەفەرموێتن:

وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ (لقمان: ١٥)

(چاكە كردن لەگەڵ دایك و باوك تەنانەت ئەگەر بانگەوازیان دەكردیت بۆ كوفر) وە ئەگەر دایك و باوكەكە هەوڵ و كۆششیان لەگەڵدا دایت بۆ ئەوەی كە شەریك بۆ من دابنێی لە كاتێكدا تۆ هیچ زانست و زانیاریەكت نیە كە خوای گەورە شەریكی هەبێ ئەوە تۆ لەو شتەدا بە قسەیان مەكە و گوێڕایەڵییان مەكە بەڵام لە دونیادا چاكەكاربە لەگەڵیاندا ئەگەر موشریكیش بوون تۆ هەر لەگەڵیاندا چاكە بكە تەنها بە قسەیان مەكە، (سەعدی كوڕی مالیك) دەفەرمێت: ئەم ئایەتە لەسەر من دابەزیوە كە زۆر چاكەكار بووم لەگەڵ دایكم، كە موسڵمان بووم، وتی ئەی سەعد ئەم دینە تازەیە چییە؟ یان دەبێت واز لە دینەكەت بێنیت یان من خواردن و خواردنەوە ناخۆم تا لە برس و تینوێتیدا دەمرم و ئەو كاتەیش خەڵكی گاڵتەت پێدەكەن و دەڵێن: ئەی بكوژی دایكت، منیش وتم ئەی دایكە وامەكە من لەبەر هیچ شتێك واز لە دینەكەم ناهێنم، شەو و رۆژێك هیچی نەخواردو ماندو بوو، شەو و رۆژێكی تریش هیچی نەخوارد زیاتر ماندوو بوو، وتم: ئەی دایكە سوێند بە خوای گەورە ئەگەر سەد گیانت هەبێت و یەك لە دوای یەك دەرچێت من واز لە دینەكەم ناهێنم، ئیتر ئارەزووی خۆتە دەخۆیت یان نا، ئەویش دەستی كردەوە بە خواردن و خواردنەوە وە تۆ شوێنی ئەو كەسانە بكەوە كە بۆ لای من گەڕاونەتەوە لە بەندە چاكە باوەڕدارەكان پاشان گەڕانەوەو سەرەنجامتان هەر بۆ لای منە وە من هەواڵتان پێ ئەدەم كە لە دونیا ئێوە چ كردەوەیەكتان كردووە.

3. بەهانەیەکی تر ئەوەیە کەوا هەندێک لە خوشکان ئەفەرموون: بەراستی ئەم ناوچەی منی لێ ئەژیم زۆر گەرمە بەرگەی گەرماکە ناگرم!

الله سبحانه وتعالى دەفەرموێتن:
قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَّوْ كَانُواْ يَفْقَهُونَ (التوبة: ٨١)

ئەی محمد (ﷺ) پێیان بڵێ: ئاگری دۆزەخ زۆر گەرمترە لەم گەرمای هاوینە ئەگەر ئێوە تێئەگەن.
وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (ئاگری دونیا بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ).
خوشکانی من شتێک بێنە پێش چاوتان ئاگری چەرخێک زۆر بچووکە، بەڵام مرۆڤ ناتوانێت بۆ ماوەی ٢ خولەک دەستی لەسەر دابنێت! باشە ئەی دەبێت گرکان چۆن بێت! ئەی نزیک بوونەوە لە خۆر دەبێت چیبێت! ئەی جەهەنەم! الله سبحانه وتعالى بە دورمان بگرێت لێی.

4. بەهانەیەکی تر ئەوەیە کەوا ئەڵێت ئەگەر حیجاب بکەم کەس نایەتە داوام.

لێرەدا چەند بابەتێک هەیە لەوانە، خوشکی بەرێزم ئەگەر ئەتان زانی چی لە خەیاڵی پیاوە (ا) خولەک بەبێ حیجاب بە دەر نەدەکەوتن! خوشکی من پیاوێک تۆی بوێت بۆ لاشە ئەم لاشە پیربوونی هەیە! ئەم لاشە پیربێت فڕێت دەدات! کاتێک کەسێک دێتە داوات کەوا حیجابیت ئەوا ئەو تۆی ئەوێت وەک تەواوکەری دینەکەی و وەک هاوسەر نەوەک تەنیا چێژی دنیا، کەسێکی لەم جۆرە دێتە داوات ئەیەوێت پێکەوە بچنە بەهەشت نەوەک بە تەنیا!

الله سبحانه وتعالى دەفەرموێتن:

وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ (طه: ١٢٤)

و هەرکەسێکیش لەو قورئانەیەم روو وەرگێڕێ ئەوە بێگومان ژیانێکی سەختی دەبێ، هەرچەند خاوەنی دونیاش بێ. بەڵێ مرۆڤ هەر کاتێک پەیوەندی لە خوا پچڕا دڵی تەنگە، بچووکە، بێئارامە، هەرگیز تێرنابێ وە لەڕۆژی قیامەتیشدا بەکوێریی حەشر و دادگایی ئەکەین.

5. هەندێک لە خوشکان دەفەرموون: دەزانین کەوا حیجاب فەرمانی الله سبحانە وتعالی یە، بەڵام کەینێکە الله سبحانە وتعالی هیدایەتی دایین دەیپۆشین!

الله سبحانه وتعالى دەفەرموێت:

وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا (الطلاق: ٣)

وە ڕزق و ڕۆزی دەدات لە لایەکەوە کە بە خەیاڵیدا نەهاتووە وە هەر کەسێ پشت بەخوا ببەستێ ئەوە خوای بەسە بەڕاستی خوا کار و فەرمانی خۆی بە ئەنجام دەگەیەنێ بێگومان خوا بە هەموو شتێک ئەندازەیەکی دیاری کراوی داناوە.

لێرەدا پرسیارێک دەکەین لە خوشکان، کاتێک تۆ برسیت دەبێت برنج و فاسوڵیات هەیە بەڵام بە وشکی، تۆ تا چەند رۆژیش هەر بڵێت دەی دەی رۆژێک خودای گەورە بۆم دەکاتە برنج و شلە (مەرەگە) ئایا ئەمە روو دەدات! یاخود وەک وتەکەی علی شەریعەت کەوا ئەفەرموێت: نموونەی ٢ کەس

بچنە ناو دەریاییێک، کەسێک بەدینە مەلەوانی نازانێت کەسێکیش بێ دینە مەلەوانی دەزانێت، هەردووک بچنە دەریاکە کامیان رزگاریان دەبێت! بێگوومان ئەوی مەلەوانی دەزانێت رزگاری دەبێت.

6. جۆرێکی تر بەهانە هەیە ئەویش دەڵێن: ئافرەتمان زۆر بینی حیجابە و لە ژێرەوە خەریکی کاری خراپەیە.

باشە راستە ئەمەش هەیە، بەڵام دەگمەنە، ئێمەی مرۆڤ دایمە بۆ سەرخستنی حەزەکانمان دەچینە سەر نموونەی دەگمەن! باشە بابڵێن هەیە لەمانەش بەڵام گوناهی حیجاب چییە؟ وەک ئەوەی لێمەکەن لە ئەوروپادا کاتێک باسی ئیسلام دەکرا، بەم جۆرە فێر ببوون کە وشەی ئیسلام بێت یانی کوشتن و سەربڕین بێ هۆکارێک، کە ئەمەش قسەیەکی سەرجادەی بەتاڵە! خوشکی من موسڵمانێک هەڵەیەک دەکات مرۆڤیش قابیلی هەڵەیە، دەکرێت کەسێکی غەیرە موسڵمان بێت بڵێ ئەوە ئیسلام هەموو ئاوان؟ مەنتیقی ئەم قسەیە لە کوێیە؟

بە نسبەت ئەوانەشی دەیانەوێت فێڵ لە الله سبحانه وتعالى بکەن حیجاب بۆ مەرامێکی دیاریکراو بەکار بێنن ئەوا لە وەڵامدا

الله سبحانه وتعالى دەفەرموێت:

يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ (البقرة: ٩)

وائەزانن خودا و باوەڕداران هەڵئەخەڵەتێنن، لەکاتێکدا جگە لە خۆیان کەس هەڵناخەڵەتێنن بێ ئەوەی خۆیان هەستی پێ بکەن.

7. جۆرێکی تر ئەوەیە خوشکان دەفەرموون گرنگ حیجاب نیە گرنگ ئەوەیە دڵ پاکبێت!

ئەمە وەک قسەیەکی باوی ناو کوڕان وایە کە ئەڵێن: کەسێکی بە ئەخلاقم، کاسێکی باشم، دڵم باشە، بەڵام نوێژ ناکەم! ان شاء الله لەسەر کوڕانیش لە کاتێکی تردا ئەدوێین لەسەریان.

خوشکان ئەمە قسەیەکی بەتاڵە و ڕەوشتی موسڵمان نیە بۆ هەواو هەوەس بتەوێت فێڵ لە الله سبحانە وتعالی بکەیت، وەک پێشتریش باسمان کرد کەوا هەچکەسێک بیەوێت الله هەلبخەلەتێنێت ئەوا تەنیا خۆی هەلخەڵەتاندوە بێ ئەوەی هەست پێبکات (البقرة: ٩)

خوشکان دڵ هەر یەک دڵە وە شوێنی یەک شتی لێ دەبێتەوە یان فرمانی الله سبحانە وتعالی یان فرمانی شەیتان دڵنیاشبن ئەوی دوای فەرمانی شەیتان بکەوێت لە خەسارەتمەندەکانن! کەلامی الله سبحانە وتعالی نورە نوریش لەگەڵ تاریکایی شووێنی نابێتەوە دڵنیابە، خودای گەورە زۆر قەومی لەناو برد بەهۆی لادانیان قەومی لووط زۆرێکمان گوێمان لێبووە بەهۆی کاری خراپەوە لەناو چوونە وە

الله سبحانە وتعالی دەفەرموێتن:

يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ (الأعراف: ٢٧)

ئەی بنیادەم! شەیتان نەتان خەڵەتێنێ ئەی نەوەکانی ئادەم! وریا بن شەیتان فریوتان نەدا و لە ئایین وەرتان نەگێڕێ هەروەک باوک و دایکتانی بەفڕ و فێڵ لە بەهەشت بەدەرکردندا و جل و بەرگەکەشیانی لێداماڵین بۆ ئەوە

عەورەتی خۆیانیان نیشان بدا و ببیبینن. بەڵێ دیارە کە مەبەستی شەیتان تەنهاو تەنها دەرخستنی عەورەتە و، ئابڕوو بردن و سووککردنی بنیادەمە، بۆیە ئەمڕۆش قوتابییەکانی دەبینی - لێرەو لەوێ - برەو و رەواج دەدەن بەداماڵینی جل وبەرگ، وە بە هەموو هێزێکیانەوە بانگەشەی ژنان دەکەن بۆ خۆ ڕووتکردنەوەو، خۆ دەرخستن و تێکەڵبوون بەپیاوان و هەڵهاتن لە داب و نەریتە ئیسلامییەکان، بەناوی ژیان و پێشکەوتن و شارستانیەتەوە! لەپشت ئەوەیشەوە مەبەستەکە دیارە و ئاشکرایە کە: تێکدان و خراپکردنی کۆمەڵ و کۆمەڵگەیە، بە وروژاندنی ئارەزووە جنسیەکان و نەهێشتنی ئەخلاق و حورمەت ورێزی نامووس و بێ غیرەتکردنی مرۆڤەکان لە ئاستی شەرەفیاندا.. ئاشکرایە کە بەرزکردنەوەی ئاڵای کۆن و تازە لەلایەن شەیتان و قوتابیەکانەوە هەربۆ ئەو مەبەستەیە، ئەگەرچی ئێستا شێوە و ڕەنگ و دەنگیشی گۆڕابێت، بەراو بۆچوونی من ئەوسووکایەتیە کە ئەمرۆ بەژنان دەکرێت لەلایەن عەلمانیەکانەوە، لەمێژووی کۆن وجاهیلیەتیشدا نەکراوە! من نامەوێ لەم کورتە تەفسیرەدا هێندێ لەوسووکایەتیانە باس بکەم بەژنان دەکرێن، ئەگینا هیچ پلەیەک نەماوەتەوە بۆیان مایەی قەدر و رێز بێت بۆیان وشیاربن لەشەیاتینەکان! چونکە هەمیشە خۆیان و کۆمەڵە و دەستە و بەستەیان ئێوە دەبینن، بەڵام ئێوە ئەوان نابینن. هەندێ لەزاناکان دەڵێن: ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەیە کە (جن)ەکان هەرگیز نابینرێن! هەندێکیش دەڵێن: ئەگەرچی ئاواش بێ، بەڵام هەر رەوا و دروستە ببینرێن. چونکە فەرموودەیەکی زۆر و زەبەنە هاتوون کە هەر لەم دنیایەدا دەبینرێن، لەسوورەتی (ئەحقاف) و (جن)یشدا زیاتر لەمبارەیەوە نووسراوە، دەتوانی سەیری بکەیت بەڕاستی ئێمە شەیاتینەکانمان کردۆتە دۆست و

یارمەتیدەری ئەوکەسانە بڕوایان بەخوا نییە، هەتا پتر سەرلێشێواوبن، واتە: کافرو خوانەناسەکانن هەردەم گوێڕایەلێیان دەکەن.

هەر وەک اللـه سبحانە وتعالی دەفەرموێتن: لەم بارەوە شەیتان مەکەنە دۆستان شەیتانی کاری ئەوەیە عەورەتتان دەرخات بە بیانوی پێشکەوتنوو شارستانی و قسە زلەکان! لەسەرەوە باسمانکردووە کە ئایا، ئەوانەی حیجابن جاهیلن بە زانست و دنیا ؟ ئەوی حیجاب بێت ناتوانێت پێشکەوتوو بێت. هتد.....؟

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێتن:

(إنما الأعمال بالنيات، وإنما لكل امرئ ما نوى)

واتا: ئیسلام کردەوەیە، دڵی چاک کردەوەی چاکی لەگەڵدا دەبێت.

کەواتا ئەگەر وەسوەسەکی شەیتان یاخوود کەسێک نەفس نزم بیەوێت لە دینت لابدات بەم قسە پروپوچانە ئەوا ئاگاداربە تۆ لە خۆشیەکیت ئەوان تێیدا نینە، بۆیە دەیانەوێت تۆش بخەنە قەفەزی خەم! نموونەش بۆ ئەمانە زۆرن وەک دەزگاکانی بەناو مافی ئافرەت هەستاون بە بێڕێزی کردنی ئافرەتان بیٚ ئەوەی ئافرەتی موسڵمان ئاگای لێبێت چۆن؟

نموونەیەکی سادە لە شاری سلێمانیدا روویدا لەم ساڵانەی دواوە کەوا، ماڵێک تەنیا ئافرەتی لیٚ دەژیت ماڵەکەیان لە نزیک دەزگای ئافرەتانە شەوێک دزێک دەچێتە سەریان، ئافرەتێکیان بەپەلە را دەکات بۆ دەزگاکە بۆ داواکردنی پاڵپشتی کەچی ئەوان هەر وەلامیشی نادەنەوە! بەڵیٚ بەرێزان ئەمە مافی ئافرەتانە بە ئارەزووی خۆیان پارە لەسەر حیسابی کچانی داوێن پاک دەخۆن! نموونە زۆرن ئەمە یەکێک بوو لەوان، لە دواتریش دا چەند

ئامارێکتـان پـێ ئەدەیـن دەربـارەی ئەوانەی حیجـاب نـین، لە دەرەوەی وڵاتـی خۆمان رۆژانە چیان لێ بەسەر دێت، لە مناڵێک تاکوو کەسێکی باڵغ!

بەهـانەی تـر زۆرن بەڵام گشـتی بـێ بنەمـان دڵنیـابن لەمە وەک لە پێشـووتر گوتمان کە دەڵێین موسڵمانین دەبێت بڵێن گوێمان گرت و ئەنجامی دەدەیـن بەبێ دوودڵـی، چـوونکە بـۆ نمـوونە: کەسـێک رۆبۆتێـک دروسـت ئەکـات، وا عەقڵەکەی بۆ دادەنێت پێی دەڵێت نەچییە ژێـر بـاران دواتـر دەمریـت، ئەگەر رۆبۆتەکە لەبەر هەوا و هەوەسی بچێت حەتمەن دەمرێت، ئەمەش تەشبیهـ نەبێت بە خودای بەرز و خاوەن شـکۆ رێـک وایە، اللـه سـبحانه وتعـالی زۆر بە رەحمە وەک سیفاتە پیرۆزەکانی الرحمن قەت خراپەی بەندەی ناوێت.

8. بەهۆی حیجابەکەمەوە لەوانەیە لە تاقیکردنەوە دەرنەچم و بکەوم.

بە هـێچ جۆرێـک رێـگە پێـدراو نـیە ئـافرەت تەنـانەت بەهـۆی کەوتنـیش لە تاقیکردنەوە حیجاب نەکاتن، چوونکە شتێک الله سبحانه وتعالی حەرامی کردبێـت ئەوا هەر حەرامە! بۆیە پێویستە ئافرەت دەست بە ئـایینەکەیەوە بگرێـت نەکـوو بەریبـداتن. دڵنیاشــبن کەوا هەر کەسـێک لە خـوا بترسـێت و کارەکـانی بەو بسپێرێت خودای گەورە باشتری بۆ دابـین دەکـاتەوە بە جۆرێـک خـۆی بە خەیـاڵی نەهاتبێت، هەر وەک الله سبحانه وتعالی ئەفەرموێت:

وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا (الطلاق: ٣)

لە شوێنێکەوە ڕزق و ڕۆزی پێ دەبەخشـێت کـە حسـابی بـۆ نـەکردبێت و خـۆی پێی نازانێت، جا ئەوەی پشت بـە خـوا ببەسـتێت، ئـەو زاتـەی بەسـە، بـۆ ئـەوەی یاریـدەدەری بێـت، چونکـە بەڕاسـتی خـوا کـارو فـەرمانی خـۆی بـە ئـەنجام

دەگەیەنێت، بێگومان خوا بۆ هەموو شتێک نەخشەیەکی دیاریکراوی بڕیارداوە (کە دەبێت پەیڕەوی بکرێت).

وە ئەوەت لەبیر بێت کەوا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێتن: ڕۆژانێک دادێن کەوا ئارامگرتن وەک ئەوە وایە کەوا پشکۆی ئاگر بگریت. ئەو کەسەی کەوا کاری چاک ئەکات ئەوا پاداشتی ٥٠ دانە پیاو هەیە کەوا چاکە دەکەن، لە شوێنێکیتردا وتراوە کەوا بە پێغەمبەر (ﷺ) وترا، کەوا پاداشتی ٥٠ پیاو لەوان؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: پاداشتی ٥٠ کەس لە ئێوە ( مەبەستی سەحابەکانە )!

گێردراوەتەوە لە لایان أبي داود (٤٣٤١) و الترمذي (٣٠٨٥)

9. باشە حیجاب خۆ بەشێک نیە لە ٥ پایەکەی ئیسلام کەواتا زۆر گرنگ نیە بیپۆشم.

ڕاستە کەوا لە ٥ پایەکەی ئیسلامدا نەهاتوە. بەڵام لە پایەی یەکەم تۆ شایەدی دەدەیت بە وجودی الله سبحانە وتعالی هەر لەوێش پەیمان دەبەستی کەوا الله سبحانە وتعالی خوای ئێمەیە، هەر چییەک ئەو بڵێت گوێڕایەڵی دەبین. حیجاب بە ئەمری الله سبحانە وتعالی فەرز کراوە. حیجاب دەبێتە پەردەیەک بۆ خۆی و دەرەوەی و دەبێتە پارێزەرێک بۆی لە دژی دەستدرێژی و توانج و لەخشتە بردنیان! چۆن؟ لە ڕووی ئاینییەوە باسمان کردووە لەم نامیلکە دووبارە ناکەینەوە. بەڵام با سەرێک لە جیهانی ماددی مۆدێرن بدەین بزانین ئەم قسەیە ڕاستە یاخوود نا!

لە بەشی (زیانەکانی سفوری لەسەر کۆمەڵگا چییە؟) ئاماژەمان بە چەند ئامارێک کردووە کەوا بەسەر ئافرەتاندا هاتووە.

له ئەمریکادا له وێبسایتێک کەوا تایبەت دانراوه به لەشفرۆشی ئۆنلاین، ڕێـژەی بەکارهێنـانی زۆر زیـادی کـردووه به تـایبەت له ئەمریکـادا ( زیـاتر له ١٥٠ ملیـۆن بەکارهێنەری هەیه)، به هۆی نەبـوونی دارایـی بـۆ ژیـان بەتـایبەت بـۆ ئافرەتـان! لێرەدا دەبینین ئافرەت کراوه به کالای سێکسی بۆ مەرامـی نێـر تەنیـا بـۆ ئەوەی ژیان ببەنه سەر و نەمرن له برساندا! بۆ نموونه یەکێـک له بەکارهێنەرەکـانی به ناوی (جاه بیله) دەڵێت: دوای ئەوەی توندوتیژیم بەرامبەر کـرا و خـوێنم لێهـات له پەیوەندی لەگەل ( بۆیفرێندم- هاوڕێ کوڕەکەم)، دواتر ناچار بـووم کەوا کـچەکەم بەخێو بکەم بەتەنها، زۆر دەگەڕام به دوای کاردا، هەر کارێکم بکردبـایه گێچەلـی سێسکیان پێم ئەفرۆشت، کاتێک ریپۆرتم ئەکرد بۆلای سـەرۆک کـارەکەم (بـۆس) ئەوا یـان قسـەی پـێم دەووت، یـا له کـاری دوور دەخسـتمەوه! دوای نەخۆشـی (پاندامێکی) کۆرۆنا، وتم باشه بۆ خۆم کۆنترۆڵی جەستەم نەکەم!

دەبینـین ئەمه نمـوونەیەکەیه له ملیۆنەهـا نمـوونه کەوا بەرجەسـتەن، کەوا ئافرەتی سفوور چی لێ بەسەرهاتووه، وه هەر سێ دانه کاردانەوەشـی له دژی بەرجەسته کراوه، کەوا بریتین له دەستدرێژی و توانج و لەخشته بردنیان!

10. قسەیەکی باویتر، ئەڵێت من زۆر لەکۆنەوه سـفورم، تـاوانم گەلێـک زۆره، زۆر کەس تووشی تاوان بوون به منەوه، خودای گەوره لێم خۆشنابێت چۆن حیجاب بکەم؟

به کورتی وەڵام ئەدەینەوه، له عەقیدەی اهلی سونەو جەماعه و وەک موسـڵمان، لەسەر ئەوه یەکدەنگن کەوا مرۆڤێک هەر تاوانێک بکات، نەزەر، زینا، درۆ، کوشـتن، شـەریک، ئەگەر تەوبەی لێبکـات ئەوا خـودای گەوره ئەم تاوانـانەی بـۆ لا ئەدات، ئەگەر نەگەڕێتەوه سەر تاوانەکان، خودای گەوره هەموو تاوانەکانی بـۆ ئەگۆڕێـت بۆ چاکه!

الله سبحانه وتعالى ئەفەرموێت:

قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ (الزمر: ٥٣)

ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە خۆتان زۆر گوناهبار کردووە نائومێد مەبن لە میهرەبانی و بەزەیی خوا چونکە بێگومان خوا لە هەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت بەڕاستی هەر ئەوە لێبوردەی بە بەزەیی یە.

وە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت:[1]

(التَّائِبُ مِنْ الذَّنْبِ كَمَنْ لَا ذَنْبَ لَهُ)

واتا: ئەو کەسەی تەوبە دەکات، وەک ئەو کەسە وایە، کەوا هیچ تاوانێکی نەکردبێت.

[1] لە صحيح الجامع الصغير. ژ ٣٠٠٨.

## سفوری چییە؟

بە دەرخستنی تەنانەت بەشێک لە جەستەی ئافرەت ئەوترێت سفوری، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((المرأة عورة)).

واتا: جەستەی ئافرەت عەورەتە.

ئایا زانیوتە سفوری زیانی هەیە؟ چۆن؟

زیانەکانی سفوری، لە باسی ئەمەدا لەکاتی خوێندنەوەدا سەرت سوڕنەمێنێت بڵێت جا چۆن ئەم هەموو زیانەی هەیە؟، پرسیارێکی جوانە، ئافرەت ٧٥٪ زیاتری کۆمەڵگا پێکدێنێت، ئافرەت بناغەی پەروەردەی کۆمەڵگایە! پیاویش بەڕێوەبەری کارەکانە.

بەڵێ ولات لەژێر دەستی ئافرەتە، ئافرەت بیەوێت تێکی بدات تێک دەچێت! بیەوێت چاکی بکات بە دڵنیایەوە چاکی ئەکات!

1. کۆیلە بوونی نەفس، ئەمە خاڵێکی گەورەیە، کەسێک کۆیلەی نەفس بووبێت هیچی پێ نەکراوە، چوونکە کۆیلەبوونی نەفس، بەرەو زۆر شتی ترت دەبات کە توانای تاک لاواز ئەکات، بەرامبەر نەفسی، هەوڵی هەر شتێک بدات، نەفس ڕێگر دەبێت لەوانە، خوێندن، تێکەڵبوونی بە کۆمەڵگا، باش مامەڵە نەکردن لەگەڵ دایک و باوک.... کۆیلەبوونی نەفس وات لێدەکات دایمە لە ناخەوە هەست بە شتێکی نامۆ بکەیت لەوانەیە نەشزانیت چییە؟ بۆ؟ چوونکە الله سبحانه وتعالى لە فیترەتی مرۆڤدا ئەمەی خوڵقاندووە کە مرۆڤ مەیلی دینی هەبێت گوێڕایەڵی الله سبحانه وتعالى بێت، بەڵام مرۆڤەکان

بەزۆر وا لە خۆیان دەکەن لەم فیترەتە دەرچـن کە ئەمەش دەبێـتە تێکچـوونی ئەصڵی مرۆڤبوونیان.

2. کات بەفیرۆدان! بەیانیان هەڵدەستن مەیـک ئـاپ (مکیـاژ) دەکەن بەم بەیـانیە نزیکەی سەعاتێکی ئەوێت. ئەم سەعاتە ئەتوانێت هەستێت وەرزشێک بکـات. بـۆ لاشـەی تەندروسـترە و پێسـتی بە سـاغی ئەمێنێـتەوە. وەک لاتـان روونە کەوا مکیاژ لە ماددەیەک دروسـت دەکرێـت، کە لە مێـرووله دا هەیە و لەگەڵ ماددەی کیمیایی تر، کە ئەمەش وا لە پێست ئەکات زووتر چرچ بێت.

3. جلی تەسک، زیانی ئێجگار زۆرە، لەوانە دەبێتە سـەڕەتانی مەمـک لە ئـافرەت و دڵەڕاوکێ دروست دەکات و زوو چوونە توالێت، زیادبوونی کـێش بەتـایبەت لە بەشی کەمەردا، کێشیەی تایبەتی کـۆ ئەنـدامی زاوزێـی ئافرەتـان، ئـازاری شـــان، پشـــت، لیمفەکـــان ( کەوا بەرپرســـە لە شـــلەکانی لاشـــە )، لە هۆشخۆچوون، کەمکردنەوەی خـوێن بـۆ نـاوچەیەک بـۆ ئافرەتـانی کێشـی زۆر ترسناکە، کێشەی مەعیدە و هەرس زۆری تر...

## زیانەکانی سفوری لەسەر کۆمەڵگا چییە؟

باسێک لە دەست درێژی کردنە سەر ئافرەت بەپێی سەرچاوەی 2018 NCVS نزیکەی ٣٧٪ ئەو توند و تیژیانەی بەسەر ئافرەت هاتووە، بریتییە لە دەست درێژیکردنە سەرناموس، پەلاماری سێکسی...

ئەوانە پەلاماردراون بەپێی ریپۆرتی خۆیان ئەو پەلاماردانە سێکسیەی کە بەسەریان هاتووە، دووقاتە بە بەراورد بە کۆن نزیکەی ١.٤ لە هەر ١,٠٠٠ کەسێکی تەمەن ١٢ و گەورەتر لە ٢٠١٧ بۆ ٢.٧ لە ٢٠١٨!

وە بە پێی ئەم داتایە نزیکەی ٧٣٤،٦٣٠ کەس تەعەدای ناموسی لێکراوە ( ئەوی هەولیداوە، ئەوەی بە تەواوی ئەنجام دراوە) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی ٢٠١٨!

1. هەست نەکردن بە ئازادی، چوونکە ئەوانە سفوورن دایمە گێچەڵی سێکسی و تانە و تەشەلی لێ دەدرێت، لە لایان رەگەزی نێری غەیرە اسلام چۆن؟ یانی ئەوەی سفور بێت لە دەرەوەی کوردستان تانی ئاوای لێ دەدرێت؟ ئەی بۆ لە کوردستان وانییە ؟ وەک وتمان لە کوردستان کەوتۆتە بەر رەحمەتی ئایینی پیرۆزی اسلام ئەگەر چی کەسێک لە دینیش کامڵ نەبێت، کاریگەری کۆمەڵگای موسڵمانی بەسەرەوەیە وای لێدەکات ئەمانە نەکات! بە نسبەت ئەویترەوە بەڵێ، لە دەرەوەی کوردستان (مەبەستمان وڵاتانی غەیرە ئیسلام) ئەم جۆرە تانە و بێزێزیە ئەکرێت، چوونکە شتێک نیە وەک ئیسلام رێگری لێبکات لەم کارانە!

بۆ نموونە:

لە توێژینەوەیەی ولاتی رۆمادا هاتەوە بە ناوی (SSR_Ro 2004)

کەوا لەو تووێژینەوەدا توندوتیژی بەرامبەر ئافرەتان کراوە لە لایەن رەگەزی بەرامبەر

ئەم تاقیکردنەوە لەسەر ٣،٣٩١ ئافرەت کراوە لە تەمەنی ( ١٥-٤٤ ساڵدا) نـزیکەی ٣٠٪

ئەوەیـان باسـکردووە کەوا ئـازار دراوون بەهـۆی ( زارەکی،لاشەیی،دەسـت درێـژی

سێکسی) نزیکەی ١،٦١٣ ئافرەت (١٥-٤٩ سـاڵدا) زیـاترە لە نیـوە ئەوەیـان باسـکردووە

کە ئەمانەیان بەسەر هاتووە لە لایەن باوانیانەوە!

وە داتایەکی تر هەیە کەوا لە ساڵی ٢٠٠٩ بۆ ٢٠١١ کـراوە کەوا لە ٨٦٩ کەس ( ٤١٤ نێـر ،

٤٥٥ مێ) دا.

لە ئامارەکە بـاس لەوەش دەکـات کەوا ئەوانەی تەمەنیـان لە خـوار ١٠ سـاڵە لە کـۆی

٣٢٦ کەس نــزیکەی لە ٣٧.٥٪ ئەمەی لەگەڵ کــراوە! وە ئەوانەی تەمەنیــان لە ١٠-١٢

ساڵە لە کۆی ٢٩٦ کەس لە ٣٤.١٪ ئەمەی لەگەڵدا کـراوە! ئەمەش زۆرتـرین رێـژەیە بە

بەراورد بە ئەوانەی تەمەنیان گەورەترە! ئەم تەمەنانەی سەرەوە تەنیـا رەگەزی مـێ

نین بەڵکو نێریشن! یانی بەرادەیەک قێزەوەنن کە باس ناکرێت!

وە هەروەها لە تـوێژینەوەیەکی تـردا هـاتوە کەوا پرسـیار لە ئافرەتـان کـراوە کەوا چ

جۆرە توندوتیژیەکیان بەرامـبەر کـراوە لە لایەن هاوبەشـەکان-خێزان یـانەوە، وە ئەو

پرسیارە لە پیاوان کراوە کە چیان کردووە بەرامـبەر ئافرەتـان، لە وەڵامـدا لە ٤١٠ نێـر و

٤٤٤ مێ لە ١٥٪ وەڵامیان نەداوە، وە نزیکەی لە ٥٦.٣٪ تونـدو تیـژی بەرامـبەر ئـافرەت

کراوە لەم ئامارەدا باس لە جۆرەکانی توندو تیژی دەکات بەم شێوە:

جوێندان و بێرێزی کردن بەرامبەریان لە کۆی گشتی نزیکەی ٤٥.١٪ بووە، وە لێک نزیک

نەبوونەوەیــان وەک ســەرجێی و نــازهەڵگرتنی ئافرەتــان نــزیکەی ١٩.٢٪ بــووە، وە

شەقلێدان و ئازاردانیان نزیکەی ١٨.٣٪ بووە، وە بەزۆر جووتپێکردنیـان بەبـیٚ ویسـتی ئافرەت بە زەبری هێز نزیکەی ٧.٨٪ بووە.

2. دامەزراوەی پارێزەی منداڵان لە ئەمریکا مـایەپووچ بـوونی خـۆی رادەگەیەنـیٚ، بەهۆکـاری زۆری دەسـت درێـژی سێکسـی بـۆ سـەر منـداڵان و کـۆنترۆڵ نەکردنی. دامەزراوەی وردبینی کوڕ لە ئەمریکا مایەپووچی خۆی رادەگەیەنـیٚ، بەهۆی دەست درێژی سێکسـی بـیٚ شـومار لەسـەر کـوڕان، نەمـانی توانـای ماددی بۆ ئامادەکاری دادگایی کردن کە زیـاتر لە ٧ هەزار سـەرکردەی پێشـتر بە تۆمەتی سێکسی لەگەڵ ١٢هەزار منداڵ بەدرێژایی٧٢ ساڵ .

3. کاریگەر سەر پیاوان، وەک لای بەرێزتان ڕوونە ڕەگەزی نێر خاڵی لاوازی مـیٚ یە وەک

الله سبحانە وتعالی دەفەرموێتن:

زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالْأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ۖ وَاللَّهُ عِندَهُ حُسْنُ الْمَآبِ (آل عمران: ١٤)

لە باسی حەزەکانی پیاو کاتێک دەگاتە تەمەنی بالغی یەکەم شت کە الـلە سـبحانە وتعالی باسی کردووە ئافرەتە! ئینجا ئەوانی تر بەدوایەوە دێن.

4. لەناو چوونی کۆمەڵگا بە هۆی کەمی ژمارەیەوە! چۆن؟

دکتۆر میکایل یاپکۆ، کەوا پسپۆری هەیە لەسەر بابەتی خەمۆکیدا ئەڵێت: من نازانم ئێوە بینیوتانە ئەم ئاگاداریە گەورەیە، لە ڕیکخراوی تەندروستی جیهانی، بەڵام لە ساڵی ٢٠٠٤ دا، ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی وتیان کەوا خەمۆکی یەکێکە لەم چوار هۆکارەی کەوا لە دوای هەریەک لە: شێرپەنجە و نەخۆشی دڵ و نەخۆشی ترن!

وە پێشبینیان کردووە کەوا لە ساڵی ٢٠٢٠ خەم و خەفەت لە ژمارە چوارەوە بۆ ژمارە دوو بەرز دەبێتە لەم هۆکارانەی کەوا مرۆڤ تووشی ئەم نەخۆشیانە دەکەن کەوا لەسەرەوە ئاماژەی پێکراوە. ڕێژەی خەم و خەفەت لەنێوان تەمەنەکانی ٢٥ بۆ ٤٤ ساڵدا باو بووە، بەڵام لە مناڵەکانیان زۆر خێراتر گەشە دەکات، ئەوەتا مناڵی ١٤ بۆ ١٥ ساڵ دەبینیت کەوا تووشی خەمۆکی بوونە!

ئەمەی سەرەوە قسەی دکتۆر میکایل یاپکۆیە دەربارەی خەمۆکی، وە ئەو ئافرەتانەی کەوا سفوورن بە ڕێژەی زۆر تووشی ئەم حاڵەتە دەبن، ئەمەش دەبێتە ئەم جۆرە لەناوبردنانە!

ئەم جۆرە خەمۆکیەش لە سەیرکردنی ڕەگەزی بەرامبەرەوە دێت بە زۆری (بەپێی زانستی سایکۆلۆژی)، بە جۆرێک ئافرەت دەڕووخێنێت کەوا چاک بوونەوەی تۆزێک ئەستەمە، چوونکە ئەم جۆرە خەمۆکیە وا لە ئافرەت دەکات کەوا کەسایەتی وەهمی دروست بکات، بە جۆرێک لە دەرەوە کەسێک بێت لە ناخیشیدا جۆرێکیتر، وە دایمە بیر لەوە ئەکاتەوە لە دەرەوە بە جوانترین جۆر خۆی بڕازێنێتەوە تاکو بەهای لەدەست نەدات، بەڵام ئەمەش ناکرێت چوونکە گوێمان لێ نەبووە، ئاسک بە قاچەکانی بچیتە لای شێر، شێریش بەبێ باج وەرگرتن بەڕێی بکاتن!

کە ئەمەش زۆر خاڵ ئەگرێتەوە بەڵام بە کورتی باس دەکەین. بریتین لەمانە:

1. کاریگەری لەسەر درەنگ کەوتن یان خۆ دورخستنەوە لە زەواج، کە ئەمەش بەڕوونی دیارە لە کوردسان، باری ماددیش هەیە، بەڵام ئەمە هۆکاری زەققە!

2. لاواز کردنی لایەنی جنسی پیاو، ئەم سفووریە وا لە پیاو ئەکات لایەنی جنسی زەعیف بێت، و زۆرێک هەوڵ بدەن بۆ کاری خراپ بۆ بەتاڵ کردنەوەی شەهوەتیان!

3. گرفتی هاوسەرگیری دەبینین لە ئێستای کوردستاندا ڕێژەی تەڵاق زۆر بووە هۆکار چییە؟ یەک لەوانە ئەم سفووریەیە چوونکە خێزانی هێناوە، بەڵام ئەوەندە سفوورەی بینیووە بە دەرەجەیەک خۆی ڕازاندۆتەوە، یانی قەناعەت بکەن ئەگەر ئەم خۆ ڕازاندنەوە بۆ مێردی خۆیان بکەن گرەنتیەکی زۆرتان پێ ئەدەم، ا پیاو سەیری ا ئافرەتی تر ناکات بەڵام وانین! وا لەم پیاوە ئەکات چاو ببرێتە ئافرەتی تر جگە لە حەلاڵی خۆی!

## حیجابی شەرعی:

مەبەست لە حیجابی شەرعی واتا: لەبەر کردنی جلووبەرگ بە پێی شەرعی ئیسلام.

وەک الله سبحانە وتعالی ئەفەرموێت:

وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُو۟لِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (النور: ٣١)

جل و بەرگی بالاّ پۆش (حیجاب): بەژنانی باوەڕدار بڵێ: با چاویان دابخەن لە تەماشای نامەحرەم و عەورەتیشیان بپارێزن لەگوناهـ زینەت، و جوانی و خشڵی خۆیان دەرنەخەن لەئاستی نامەحرەم، بێجگە لەوەی لێی دەردەکەوێ، واتە: ئەو ئەندامانە نەبێت لە کاتی ئیش و کاری ناو ماڵدا دەرئەکەون وەک دەم و چاو و هەردوو دەست -وەک ئیبن عەبباس دەڵێ، ئەوە ئاساییە. (شێخی بەیزاوی) یش ئەڵێت: قسەی ڕاست ئەوەیە: مۆڵەتدان بۆ دەرکەوتنی دەم و چاوو هەردوو دەست تەنها بۆ کاتی ئەنجامدانی نوێژەکانە، نەک لە دەرەوەی نوێژەکان، چونکە هەموو جەستەو لاشەی ژنان عەورەتە و ڕەوا نییە دەرخستنی و تەماشا کردنی، بۆ مێرد و مەحرەم نەبێت، وەهەروەها یاساغە بۆ نامەحرەم تەماشای هەر جێگایەکی ژنان بکات، مەگەر کاتی ناچاریی، وەک سەیرکردنی پزیشکی پیاو، کاتێ پزیشکی ژن نەبێت، یا کاتێ بۆ هەڵگرتنی شایەتی بێت. بەشێکی زۆر لە زانایان ئەڵێن: نابێ ئافرەتیش

سەیری هیچ شوێنێکی پیاوان بکا، نەبە ئارەزووەوە، نەبە ناچاریی، بـە بەڵگـەی ئـەم فەرموودەیە (ئیمامی تیرمزیی) ئەیگێڕێتەوە لـە (ئـوم سـەلەمە) وەکـە ئـەوو (خـاتوو مەیمونە) لای پێغەمبەر (ﷺ) بوون، جا لەوکاتەدا (ئیبن ئـومی مـەکتومی) نابینا هـات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: چـاوی خۆتـان بگـرن لـە نـەزەر و خۆداپۆشـن! ئـوم سـەلەمە ئەڵێ: وتـم: باشـە! ئـەی ئـەو نابینا نییـە؟ فـەرمووی ئـەی بـۆ ئێـوەش ئـەو نـابینن؟ هەندێکی دی پێیـان وایـە سـەیرکردنی ژنـان بـۆ پیـاوی نامـەحرەم بـەبێ ئـارەزوو و ئەنقەست ڕەوایە، وەک لە فەرموودەیەکی (متفق علیە) دا هاتووە: (حەبەشـە)ییەکان ڕۆژی جـەژن شـەڕەنێزەیان ئـەکرد لەمزگەوتـدا پێغەمبـەر (ﷺ) خۆیشـی سـەیری دەکردن و خاتوو عائیشەیشی لە پشت خۆیەوە دانابوو سەیری دەکردن. با گۆشـەی سەرپۆش و لەچکەکانیان بدەن بەسەر سینگیشیاندا تا گەردن و سـینگ و بـەرۆکیان دەرنەکەوێ وخشڵ و جوانیی و زینـەتیان 'سـەر و مـل و گـوێ و سـنگ و قـۆڵ و بـاڵ قاچیان دەرنەخەن بۆ مێردەکانیان نەبێت یان بۆ باوکیان، یـان بـۆ بـاوکی شـووەکانیان 'خەزوریان' یان بۆ کوڕی خۆیان یان بۆ کـوڕانی مێردەکانیـان یـان بـۆ براکـانی خۆیـان یان بۆ کوڕی براکانیان یان بۆ کـوڕی خوشـکەکانیان چونکـە ژیـان لەگـەڵ ئـەو جـۆرە کەسانەدا کەمتر چاوەڕوانی فیتنەو کاری خراپیان لێوە دەکرێ. جا لەبەر ئەوە بـۆ ژنـان ڕەوایە دەست و پێ و لاق و سەرو مل و سینگ لە لای ئەوانەدا دەر بخـەن. ئەڵبەتـە بۆ مێردەکانیان زیاتریش لەوانە دروستە یا بۆ ژنانی هاو بڕوایـان: وەک خۆیـان. بـەڵام نابێ لەلای ژنێکی پاشگەز بووە، یان لەلای ژنانی جوولەکە و گاوردا خۆیان دەربخـەن یان ژنە بەندەکانیان -کـەنیزان-. بـەڵام زانایـان لـەنێری خولاّمیانـدا قسـەی جیاوازیـان هەیە یان پیاوانی شوێنکەوتووانی ژنان بێ ئـارەزوو بـێ نیـاز. (لەخزمـەتکار و گێلـە پیاو) کە هەستی ژن و مێردییان نیـە . جـا لەبـەر پیریـی، یـان لەبـەر پەتـەڕییان، یـان لەبەر ئـەوە کـەڵکی ژن و مێردییـان پێـوە نـەبێ، مەبەستیشـیان لـە شـوێنکەوتنیان تـەنها تێرکردنـی ئـارەزووی زگیانـە یـان ئـەو منداڵانـەی ئاگایـان لەبـەدەن و جـێ

شەرمی ژنان نیە و، هێشتا باڵغ نەبوون و کاروباری ژن و مێردی نازانن، دیارە ئـەوەش گوناهـ نییە ژنان دەسـت و پـێ و مـل و سـنگیان لەلایانـدا وەدەرخـەن  وە هـەروەها ژنـان -لـەکاتی رۆیشـتندا، نـابێ پێیـان بەزەویـدا بـدەن کـە بزانرێـت چ خشـڵ و زینەتێکیان داشاردووە. لەسەردەمی نەفامیدا ژنان بەلای خەڵکدا ئەڕۆیشـتن و تونـد قاچیـان بەزەوییـدا دەدا و خـڕەی خرخـاڵ و پاوانـەو بازنـەکانیان ئـەهات تـا مـەردوم سەیریان بکات، جا خوای گەورە فەرمووی نابێ ئەو کـارە بکـەن، ئێسـتاش گـەلێ لـە ژنان جۆرە پێڵاوێ لە پێ دەکەن و لەکاتی رۆیشتندا توند بەزەویی دەدەن و تەقـەی دێت! {وتوبوا إلى الله جميعا أيها المؤمنون} کـەوابوو ئـەی بـاوەڕداران! هـەمووتان بەرەو لای خوا بگەڕێنەوەو پەشیمان ببنەوە و چاوتان لەئاسـتی نامـەحرەم دابخـەن و عەورەتتان بپارێزن.. بەشکو گشتیان هەم لـەدونیا و، هـەم لەقیامـەت، ڕزگـارو بـەختیار ببن و، بۆ هەتا هەتاییش لەگوناهـ و سەرپێچی دوور بکەونەوە.

**بە کورتی مەرجەکانی حیجابی شەرعی بریتین لە:**

1. واجبە کەوا هەموو جەستەی داپۆشێت.
2. واجبە ئەستوور بێت ( نەوەکو تەنک بێت لاشەی بەدەر کەوێت لەدەرەوە ).
3. واجبە کەوا تەسک نەبێت واتا فش یا پەرش و بڵاوبێت.
4. واجبە ڕازاوە نەبێت، نەکوو سەرنجی خەڵک ڕاکێشێت.
5. واجبە کەوا بۆندار نەبێت.

6. نابێت لەو جلە بێت کەوا خۆتی پێدەربخەی (وەک لە حدیثی پێغەمبەر (ﷺ)هاتووە ئەفەرموێت: [2] هەر کەس ئەم جۆرە جلە لەبەر بکات ئەوا، لە رۆژی لێپرسینەوە جلی شەرمەزاری لەبەر دەکات).
7. نابێت جلێک بێت وەک جلی پیاوان، لە سەردەمی ئەمرۆکەدا زۆربەی ئافرەتان جلی پیاوان لەبەر دەکەن بە پێچەوانەشەوە، وە پێغەمبەر (ﷺ) نەفرەتی لەوانە کردووە.
8. نابێت ئافرەتان چاولێکەربن لەڕووی مۆدێلی جلوبەرگی نەشیاوی (کافران)، چوونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێتن: [3] (ومن تشبه بقوم فهو منهم).
9. نابێت وێنەی روح لەبەرێکی لەسەربێت (وەک مرۆڤ و ئاژەڵ).

---

[2] ابن ماجه. ژ ٣٦٠٦. حديث حسن (دار السلام).
[3] داود. ژ ٤٠٣١. احمد. ژ ٥١١٤. حيدث صحيح.

## نیقاب بۆ کێ فەرزە؟

لەم بەشەدا بە کورتی و بە پوختی باس دەکەین. ئەم پوختیەش بۆ کەسێکی ژیر و هۆشیار کافیە بۆ تێگەیشتن لەم بابەتە.

نیقاب واتا: داپۆشینی ڕوخسار.

هەر یەک لە نیقاب و دەست داپۆشین تەنیا بۆ کەسانێکی دیاریکراو فەرزن! چۆن؟

هەر چوار مذهبەکە ئەفەرموون: نیقاب و دەست داپۆشین فەرزن، بۆ ئافرەتێک کەوا جوانیەکەیان لە ڕادەبەدەر بێت، ئەم جوانیەیان ببێتە فیتنە لەسەر کۆمەڵگا!

## پاداشتی پۆشینی حیجاب

بەڕاستی هەر خوشکێک ئەم پاداشتانەی بزانیبایە، ئەوا هەرگیز خۆی لێ بەدور نەدەگرت لەم پاداشتە! بەڵکوو هەموو هەوڵی خۆی ئەدا بۆ بەدەست هێنانی!

کورتەیەک لەم پاداشتانە کەوا ئافرەتێک، بەدەستی دەهێنێت لە کاتی پۆشینی حیجابدا، بریتین لەمانەی خوارەوە:

1. الله سبحانه وتعالی ئەفەرموێت:

**وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ نَقِيرًا (النساء: ١٢٤)**

واتا: کەسێکیش کردەوە چاکەکان جێ بەجێ بکات لە نێر یان لە مێ لە هەمان کاتدا ئەو کەسە بڕوادار بێت ئەوە ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە و بچووکترین ستەمیان لێ ناکرێت هێندەی توێکڵی ناوکە خورمایەک.

2. الله سبحانه وتعالی ئەفەرموێت:

**مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٌ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ (النحل: ٩٧)**

واتا: هەرکەس لەنێر یان لە مێ کردەوەی چاکی کردبێ و بڕواداریش بوو بێت ئەوە سوێند بەخوا بە ژیانێکی خۆش دەیان ژیەنین و سوێند بێ پاداشتیان دەدەینەوە بە چاکتر لەوەی کە ئەوان دەیانکرد.

3. الله سبحانه وتعالى ئەفەرموێت:

مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ (غافر: ٤٠)

واتا: هەر کەسێک کاری خراپەی کردبێ هەر بە ئەندازەی خراپەکەی سزا دەدرێ هەر کەسیش چاکەی کردبێت ئافرەت بێ یا پیاو و باوەڕدار بێ ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە لەوێدا بێ ژمار ڕزق و ڕۆزییان پێ دەدرێ.

4. الله سبحانه وتعالى ئەفەرموێت:

إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا (النساء: ٤٠)

واتا: بەسەنگی وردیلەیەکیش ستەم لەکەس ناکرێ: {إن الله لا يظلم مثقال ذرة} بێگومان خوا بەسەنگی بچووکترین گەردیلە (زەررە).. ستەم لەهیچ کەس ناکا {و إن تک حسنة يضاعفها} و ئەگەر بەئەندازەی گەردیلەیەک چاکە بوو، خوا بەرەکەتی بەسەردا دەڕێژێ و دووئەوەندە پاداشی ئەداتەوە {و يؤت من لدنه أجرا عظيما} و لای خۆی پاداشتێکی گەورەی پێدەبەخشێ

5. الله سبحانه وتعالى ئەفەرموێت:

إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا (الأحزاب: ٣٥)

واتا: بەڕاستی پیاوە موسوڵمانەکان و ئافرەتە موسوڵمانەکان، وە پیاوە باوەڕدارەکان و ئافرەتە باوەڕدارەکان و پیاوانی هەمیشە گوێڕایەڵ و ئافرەتانی هەمیشە گوێڕایەڵ و پیاوە ڕاستگۆکان و ئافرەتە ڕاستگۆکان و پیاوان و ئافرەتانی خۆگر و، بەئارام وە پیاوانی لەخوا ترس و ژنانی لەخوا ترس، و پیاوان و ئافرەتانی بەخشندە و پیاوان و ئافرەتانی ڕۆژوەوان پیاوان و ئافرەتانی داوێن پاک پیاوانێ کە زۆر یادی خوا دەکەن و ئافرەتانێ کە زۆر یادی خوا دەکەن خوا ئامادەی کردووە بۆ هەموویان لێخۆش بوون و پاداشتی گەورە.

.6

پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت[4]:  ئەو کەسەی کەوا دەست بە سوننەتم ئەگرێت لە کاتی تێکچوونی ئوممەتم، پاداشتی شەهیدێکی هەیە.

وە شەهیدیش بەبێ پرسیارکردن ئەچێتە بەهەشتەوە. ئەگەر ئەمە پاداشتی دەست گرتن بێت بە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە سەردەمی تێکچوونی ئوممەت (وەک ئەمرۆ)دا . ئەی دەبێت پاداشتی ئەوە چۆن بێت کەوا حوکمێکی فەرزی الله سبحانه وتعالى جێ بەجێ بکەیت!

.7

لە أَبِي أُمَيَّةَ الشَّعْبَانِيِّ ئەفەرموێت[5]: پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەفەرموێت: ..... لە پێش ئێوەدا ڕۆژانێک دێتە پێشتان کەوا ئارامگرتن لەم ڕۆژانەدا وەک ئەوە وایە کەوا

---

[4] ئەم حدیثە بە زەعیف (لاوان) دانراوە لە لایان شێخی البانی لە  سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة مجردة عن التخريج مرتبة على الأبواب الفقهية (٣٢٧).

[5] جامع الترمذي. ژ ٣٠٥٨. حديث صحيح (دار السلام).

پشکۆیەک ئاگر بگریت. وە ئەوەی کەوا کاری چاک دەکات لەم کاتەدا پاداشتی ٥٠ کەسی هەیە. پێیان فەرموو: ٥٠ کەس لە ئێمە یان ئەوان؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نەخێر! بەڵکو پاداشتی ٥٠ کەس لەئێوە!

.8

الله سبحانه وتعالى لە حدیثی قودسیدا ئەفەرموێت:[6]

لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) کە پێغەمبەر (ﷺ)  دەفەرموێت: «خوای گەورە دەفەرموێت: ئەوەی دژایەتی وەلیەکی من بکات، ئەوا من جەنگی لە دژ ڕادەگەیەنم، وبەندەکەم بە هیچ شتێک لە من نزیک نابێتەوە کە خۆشەویست بێـت لە لام هێندەی نزیکبوونەوەی لێم بە ئەنجامدانی فەریزەکان، وبەندەکەم بەردەوام لێم نزیک دەبێتەوە بە ئەنجامدانی کردەوە نافیلەکان، هەتاوەکو خۆشم دەوێت، ئەگەر خۆشم ویست: ئەوا دەبم بە ئەو بیستنەی کە پێی دەبیستێت، وئەو بینینەی کە پێی دەبینێت، وئەو دەستەی کە شتی پێ وەردەگرێت، و ئەو پێیەی کە پێی ڕێدەکات، ئەگەر داوام لێبکات ئەوا پێی دەبەخشم، وئەگەر پەنام پێبگرێت ئەوا پەنای دەدەم، لەسەر ئەنجامدانی هیچ کردەوەیەک بە گومان نەبووم وەکو گومانم لە کێشانی ڕۆحی ئیماندار، حەز لە مردن ناکات، ومنیش حەز ناکەم ئازاری بدەم.

لا اله الا الله لەم حدیثە! ئێمەی عەبدێکی لاواز، خودایەکی خاوەن بە دەسەڵات ئاوا بە عەبدەکانی ئەفەرموێت!

---

[6] البخاری دەریهێناوە، کتاب الرقاق، باب التواضع ١٠٥/٨، ژ ٦٥٠٢.

بەڵێ خوشکان ئەمە پاداشتی سەبرگرتنتانە لەسەر فەرمانەکانی الله سبحانه وتعالی.

## سزای نەپۆشینی حیجاب چییە؟

ئافرەتێکی سفوور ئەفەرموێت: من کەسێکی باشم دڵم باشە رێز لە دایک و باوکم دەوروبەرم ئەگرم، کاری خێر ئەکەم، قورئان ئەخوێنم، نوێژ ئەکەم، بەڕۆژوو ئەبم، هەموو کارێکی چاک ئەکەم، بەڵام سفورم! هەر بۆیە ئەم سفووریەش شتێکی گەورە نیە بە بەراورد بەم کارانەی دەیکەم!

باشە چەندانی تر وەک ئەم خوشکە هەن وە هەمان بیرۆکەشیان هەیە، جا با بزانین وایە؟

لێرەدا با هەژماریەک بکەین بەیەکەوە، نموونەی ئافرەتێکی گەنج ئەهێنینەوە کەوا سفوورە، سەرەتا کە لە خەو هەڵدەستێت باسی کات کوشتن و خەرجی و نەخۆشی ناکەین چوونکە کردوومانە، ئەم ئافەرەتە لە ماڵ ئەچێتە دەرەوە بەرەو زانکۆ ئەچێت بەڕێوە، تەکسیەکەی دێت کەوا گومانی تێدا نیە نا مەحرەمە، هەر لەناو سەیارە ئەم تەکسیە کەوا لەگەل ئەم ئافرەتەیە، با بزانین چەند زینا بۆ ئەم ئافرەتە دێتن هەر لەناو سەیارە با هەژماری بکەین:

یەکەم/ زینای چاو

دووەم/ زینای گوێ

سێیەم/ زینای زمان

چوارەم/ زینای دڵ

لەیەک کەسدا ٤ زینا بۆ ئەم ئافرەتە دێت، لە کاتی چوونی بۆ زانکۆ دڵنیاشن کەوا نێری تر سەیری دەکات. با بڵێین ٥ کەسیتر سەیری دەکاتن، لەوانیش زینای یەکەم و چوارەم وەردەگرێت، تا ئەگاتە کۆلێژ. لە کاتی هاتنە خوارەوەی ئەگەر دووبارە ٥ کەسیتر سەیری بکاتن، بە هەمان شێوە زینای یەکەم و دووەم و چوارەم وەر دەگرێت. وە تا ئەچێتە کلاسیش بە هەمان شێوە هەر ٣ جۆرە زیناکە وەردەگرێت، وە لەناو کلاسیش بە هەمان شێوە، لە کاتی ڕێستەکانیش (پشووەکان) بە هەمان شێوە، لە کافتریا لە باخچەکە تا ئەچێتەوە ناو سەیارە و دواتر بۆ ماڵەوە بە نزیکەی ١٠٠٠ زینا کۆ دەکاتەوە! ئەمەش بە کەمترین هەژماردن چووکە زۆر زیاتر لەمە وەر ئەگرێت!

ئێستا خوشکی بەڕێزم، کەتۆ بیرت لەوە نەکردۆتەوە سفووری چەند زینا هەڵدەگرێت بێ ئەوەی ئاگاداربیت، ئێستا زانیت وە زۆریتر هەڵدەگرێت، لەوانە دڵی گەنجێک نەخۆش دەکەیت تووشی هەر تاوانێک بێت لە بچووک تا گەورە تۆش بەژدار ئەبیت لەگەڵی!

پێش هەمووشتێک، ئێمە وەک ئەهلی سونە و جەماعە کەوا لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) و سەلەف و پیاو چاکانین، یەک دەنگین لەسەر ئەوەی کەوا مرۆڤ بە گوناح بۆ هەتا هەتا لە دۆزەخ نابێت!

ئافرەتێکیش کەوا بڕوای بە حیجاب هەیە بەڵام نایکات، ئەوا تاوان بارە و خودای گەورە سزای ئەدات بەڵام بۆ هەتا هەتا لە دۆزەخ نابێت!

بەڵام ئەمە بزانن لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا، هەر ئەمرێک ( فەڕزێک ) ڕەت بکرێتەوە کەوا خودای گەورە ئەمری پێکردوە و باوەڕت پێی نەبێت، خۆت پێ زاناتربێت لە الله، ئەگەر بشزانیت تاوانە ئەم کارە هەر بشی کەیت، خودا پەنامان بداتن لە ئایین هەڵدەگەڕێیتەوە! بۆ حیجابەکەش بەهامن شێوەیە! بەڵام ئەمە کاری موسڵمانی ئاسایی نیە، بەڵکو کاری قازی موسڵمانە بڕیار لەم بارەوە بدات، بۆیە بۆ کەسی

ئاسایی ڕێگە پێدراو نیە، بە کەسێک بڵێت تۆ لە ئایین دەرچوویت چوونکە زانستی پێی نیە و بواری ئەو نیە!

بە دوو دانە حدیث کۆتایی بەم بەشە دەهێنین ئەوانیش بریتین لە:

1. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:[7]

**(صنفان من أهل النار لم أرهما بعد: قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربون بها الناس، ونساء كاسيات عاريات، مائلات مميلات رؤوسهن كأسنمة البخت المائلة، لا يدخلن الجنة ولا يجدن ريحها، وإن ريحها ليوجد من مسيرة كذا وكذا).**

واتا: دوو کۆمەڵ لە خەڵکی دۆزەخ نەمبینیون: کۆمەڵێکیان قامچیان پێ یەو وەک کلکی مانگا وایە پێی دەدەن لە خەڵکی، وە کۆمەڵەکەی تریان ئافرەتانێکن جلیان لەبەردایە و ڕووتیشن، و لە ڕێگە بە لەنجەو لار دەڕۆن تا سەرنجی پیاوان بۆلای خۆیان ڕابکێشن، قژیان دەبەستن و کۆی دەکەنەوە لە سەر تەوقی سەریان وەک کۆپارەی ووشتر (البخت)ی لێ دەکەن، ئا ئەم ئافرەتانە ناچنە بەهەشتەوە و بۆنیشی ناکەن، لە گەڵ ئەوەی بۆنی چەندەها ساڵ بۆنی دەڕوات. ئەم فەرموودەیە هەڕەشەیەکی ڕوون و ئاشکرای تیایە بۆ ئەو ئافرەتانەی کە حیجابی شەرعی ناپۆشن یان جلیان لە بەردایە بەڵام ڕووتن واتا یان جلەکانیان کورتە و بەشێک لە ئەندامەکانی لەشی بەدەر دەکەوێت یان تەنکە و لاشەی دیارە یان تەسکە، بێ گومان دیارە تاوانەکە زۆر گەورەیە. ئەگەر نا چۆن بەهۆی ئەم تاوانەوە ناچنە بەهەشت. بەڵکو (سبحان الله) هەر بۆنی بەهەشتیش ناکەن. جا لەو هەڕەشە گەورەتر هەیە. (پەنا بەخوای گەورە.)

---

[7] ئیمامی موسلیم دەری هێنایە لەباسی جل و ڕازاندنەوەو جوانکاری و لەباسی حەدیسی الكاسيات العاريات المائلات المميلات ژ ٢١٢٨.

2. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

**(ثلاثة لا تسأل عنهم - يعني لأنهم من الـهالكين-: رجل فارق الجماعة وعصى إمامه ومات عاصياً، وأمَة أو عبد أبق فمات، وامرأة غاب عنها زوجها، قد كفاها مؤونة الدنيا، فتبرجتْ بعده، فلا تسأل عنهم).**

واتا: سێ جۆرە کەس هەن سەبارەتیان هیچ پرسیار مەکەن ـ واتا: تیاچوون ـ پیاوێک لە کۆمەڵی موسڵمان دوور بکەوێتەوە سەرپێچی سەرکردەی موسڵمانانی کردبێت و لە سەر ئەم سەرپێچییە بمرێت، وە کۆیلەیەک ڕابکات لەژێر دەستی خاوەنەکەی و نەگەڕێتەوە تا دەمرێت، و ئافرەتێک پیاوەکەی بڕوات و سەفەر بکات و هەموو پێویستی یەکانی بۆ دابین کردبێ لە گەڵ ئەمەدا بچێت خۆی دەربخات، و جوانی خۆی بۆ پیاوانی نا مەحرەم بەدەربخات. هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) لەو شتانەی کە لە سەری بەیعەتی لە ئافرەتان وەردەگرت دوورکەوتنەوە بوو لە سفوری و جوانی دەرخستن وەک لەفەرموودەکەی (أميمة بني رقيقة) هاتووە کە بەیعەتی دا بە پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی هاوەڵ بۆ خوا بڕیار نەدەی وە دزی نەکەی وە زینا نەکەی، و منداڵەکانی خۆت نەکوژی وە بوختیان بۆ کەس هەڵنەبەستی وە هاوار و شیوەن و ڕۆڕۆ نەکەی وە جوانی لەشت بەدەر نەخەی بۆ بێگانە.

## پرسیار کردن لە چەند کەسێک بۆچی حیجاب دەپۆشن؟

**وەڵامەکانیان:**

ئەنیسە لە فەرەنسا ئەژیت پرسیاری ئەوەی لێ دەکرێت بۆچی حیجاب دەپۆشی؟، لە وەڵامدا ئەڵێت کەوا رۆژێک لە رۆژان بیرم کردەوە بۆچی الله پێمان دەڵێت خۆتان داپۆشن لەسەریم خوێندەوە کەوا ئافرەت وەک ئەڵماس وایە بۆیە حیجاب دەکەین کاتێک حیجاب ئەکەم هەست بە پارێزگاری دەکەم بەرامبەر جیهان.

سەبرینا خەڵکی مالیزیایە هەمان پرسیاری لێ دەکرێت لە وەڵامدا ئەڵێت من لە تەمەنی ١٣ ساڵیدا وا فێربوومە لەسەری کەم لەسەرم دەکرد تێنەدەگەشتم، بەس ئێستا تەمەنم ٢١ ساڵە دەزانم کەوا حیجاب وەک قەلغان وایە بۆ من، وە نزیکم دەکاتەوە لە الله منیش حەزدەکەم نزیکم بم لە الله بۆیە دەیپۆشم.

ڕوکایە لە فەرەنسا هەمان پرسیار ئاراستەی کرا لە ولامدا وتی کەوا من شانازی بە حیجابم دەکەم، حیجاب وەک پارێزەرەک وایە بۆم!

ئەڤیلە مالیزییە هەمان پرسیاری لێکرا لە وەڵامدا وتی: کاتێک لاشەی خۆت زۆر دەردەخەیت وا لە خەڵک دەکەی سەرنجت بدەن و سەیرت بکەن بە جۆری جیا! بەمە ئەوترێت بەرپرسیارێتی بۆیە من پێم باشە خۆم داپۆشم نەوەک خۆم دەرخەم.

ڤەینیم خەڵکی ئیسپانیایە هەمان پرسیاری لێکرا لە وەڵامدا وتی من حیجابم ئەپۆشت بەڵام دواتر بۆ ماوەی ساڵانێک تەرکم کرد، وابیرم دەکردەوە کەوا ئیمان تەقوا بە حیجاب نیە دواتر رۆژێک وتم با دوبارە تاقی ببکەوەمەوە لەوکاتەوە تەرکم

نەکردووەوە، نەک لەبەر ئەوەی فێرکراوم حیجاب بپۆشم بەڵکو ئەمە بڕیاری خۆم بووە نەک بەزۆر کاتێک حیجاب یەکەم هەست بە ئارامی ئەکەم.

چەندان بەسەرهاتی تر هەیە کەوا ئافرەتان بە ویستی خۆیان حیجاب دەکەن و هەست بە پارێزگاری دەکەن!

کۆتایی نامیلکەکە بەم چیرۆکە دەهێنم، بەڵام تکام وایە بە دڵ بیخوێننەوە و لەسەری ڕاوەستن، بۆ ئەوەی ببێتە ڕێگای هیدایەت وەکو ئەم تابیعینە (شوێنکەوتوە)!

تەوبەی مالیکی کوڕی دینار ( ڕەزاو ڕەحمەتی الله ی لەسەربێ ) یەکێکە لە زانایانی تابیعین. ئەم زانا بەرێزە ئەفەرموێت: لەسەرەتای ژیانمدا بە گومڕایی و سەرخۆشی و سەرپێچی دەستمپێکردبوو. ستەمم لە خەڵک دەکرد و مافم دەخواردن، سووم دەخوارد، هیچ گوناهێک نەبوو نەمکردبێ. ئەفەرموێت: ڕۆژێک لە ڕۆژان بە پەرۆشبووم ژن بێنم و کچێکم هەبێت، دواتر ژنم هێناو کچێکم بوو ناوم نا فاتیمە. بە جۆرێک کەوا نایەتە هزر ( مێشکەوە ) خۆشمدەویست، هەرکاتێک ئەو گەورە دەبوو من ئیمانم لە دڵمدا گەشەی دەکرد و تاوان لە دڵم کەم دەبۆوە! ڕۆژێک فاتیمە جامێک عارەقی لە دەستم بینی نزیک بۆوە و لێی ڕژاندم، کە ئەوکات تەمەنی ٢ ساڵانبووا دواتر ئەفەرموێت: کاتێک فاتیمە تەمەنی گەیشتە ٣ ساڵ وەفاتی فەرمووا! وای لێهات من لە جاران زۆر خراپترم دەکرد بە هەموو تاوانەکانەوە! تا ڕۆژێک شەیتان زیاتر یاری پێمکرد و پێمی وت: ئەوەندە بخۆوە کە پێشتر نەتخواردبێتەوە. مالیکی کوڕی دینار ئەفەرموێت: چەند خەوێکم لەو کاتانەی زۆرم دەخواردەوە دەبینی یەکیک لەوانە. دیتم ڕۆژی زیندووبوونەوە دا هاتوە خۆر تاریک بوو و دەریاکان بوونە ئاگرو زەوی بومەلەرزەی گرت و خەڵکی کۆکرانەوە بۆ لێپرسینەوە و خەڵک پۆل پۆل بوون، منیش لەناو خەڵکەکەدا بووم، بانگدەرێک بانگی

دەکرد فلاَنی کوڕی فلان وەرە، بەرامبەر خودای دەسەلاَتدار، دەمدیت ئەو کەسە لە ترس و تۆقیندا ڕووخساری ڕەش هەڵدەگەرا، هەتا بانگی من هاتو بانگی کردم مالیکی کوڕی دینار، وەرە بەرامبەر خودای دەسەلاَتدار، جا خەڵکی لە دەورم بزربوون، وەکو ئەوەی کەس لە گۆڕەپانی ئەوێ نەبێ، دیتم عەزیایەکی زۆر گەورە بەهێزو سامناک دەمی کردبۆوە و بەرەو لای من دەهات، ئەمنیش لەو پەڕی تۆقیندابووم، ئینجا پیرێکی لاوازم دیت پێم وت: لەو عەزیایە ڕزگارم بکە، فەرمووی: ڕۆڵە بێهێزم و ناتوانم بەلاَم بەو لایەدا ڕاکە، بەڵکو دەربازت بێ، جا هەلاَتم بۆ ئەو لایەی کە ئاماژەی پێکردبوو، عەزیاکەش بەردەوامە لە دوامەوە، ڕووبەرووی ئاگر بوومەوە و وتم: ئایا لە عەزیایەکە هەڵێم بکەومە ناو ئاگر؟ جا بە پەلە گەرامەوە و لە عەزیاکە نزیکبوومەوە، گەرامەوە لای پیاوە لاوازەکە و وتم: توخودا فریام کەوە و ڕزگارم کە، دەستی بە گریان کرد بۆ حاڵی من و فەرمووی: ئەمن بێ دەسەلاَتم بەلاَم بەولایەدا ڕاکە بەرەو ئەو چیایەکە کۆمەڵێک منداڵی ساوام دیت، گوێم لێ بوو منداڵەکان هەموو دەیانزیڕاند و ئەیانوت فاتیمە بگە باوکت بگە باوکت! وتی: ناسیمەوە کچەکەم بووە، دەڵێ: دڵخۆشبووم کچێکم هەیە و لەتەمەنی سێ ساڵی مردووە لەو مەرگە ساتە و بەهانام دێت، ئینجا بەدەستی ڕاستی منی گرت و بە دەستی چەپی عەزیاکەی دوور خستەوە، منیش لە ترسان وەکو مردووم لێهاتبوو، دواتر فاتیمە لە باوەشم دانیشت کەوا چۆن دا ئەنیشت پێش وەفاتی پێمی فەرموو:

أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ (الحديد: ١٦)

ئایا وەختی ئەوە نەهاتووە بۆ بڕواداران کە دڵیان ملکەچی بێ بۆ ئامۆژگاری خوا و ئەو قورئانەی کە ناردویەتیە خوارەوە؟ وەک ئەو کەسانە (جوولەکەو گاوور) مەبن کە

لەمەوپێش کتێبی ئاسمانیان پێدرا وە ماوەیەکی دووروو درێژیان بەسەردا تێپەڕی ئینجا دڵیان ڕەق بوو وە زۆربەیان یاخی و لە سنوور دەرچوون.

دواتر وتم: کچەکەم ئەو عەزیایە چییە پێم بڵێ: فاتیمە فەرمووی: ئەوە کردەوەی خۆتە کە کردوتەو گەورەت کردووە، هەتا خەریک بوو بتخوا، باوکە نەتزانیوە هەموو کردەوەکانی دونیا لە ڕۆژی قیامەت بەشێوەیەکی بەرجەستە دێتەوە ڕێت. مالیکی کوڕی دینار فەرمووی: ئەی ئەو پیرەمێردە لاوازە؟ فاتیمە فەرمووی: ئەویش کردەوە چاکەکانت بوو، تۆ کردەوەی کەم و بێ هێزت کرد هەتا بۆ حاڵت گریا و نەیتوانی هیچت بۆ بکا! ئەگەر منیش لە ساوایی نەمردبام ئێستا هیچ شتێک بە کەڵکت نەدەهات! مالیکی کوڕی دینار ئەفەرموێ: لە خەونەکەم بەخەبەر هاتمەوە بە گریانەوە هەر ئێستا خودایە.... هەر ئێستا خودایە تەوبە دەکەم فەرموێ: دەڵێ خۆم شوشت و بۆ نوێژی بەرەو تەوبەو گەڕانەوە بەرەو خودا دەرچووم، دەفەرموێت: چوومە ژوورەوەی مزگەوت دیتم پێش نوێژ هەمان ئایەت دەخوێنێتەوە (الحديد: ١٦)!

ئینجا مالیکی کوڕی دینار هەموو ڕۆژێک لەبەردەم دەرگای مزگەوت ڕادەوەستا و دەیفەرموو: ئەی بەندەی تاوانبار بگەڕێوە لای پەروەردگارت، ئەی بەندەی بێ ئاگا بگەڕێوە بەرەو لای خودات، ئەی بەندەی یاخی بگەڕێوە لای خودا، خودا شەو و ڕۆژ بانگت دەکات دەفەرموێ:

لە أنس بن مالك وأبي هريرة کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی[8]: ذا تَقَرَّبَ العبدُ إليَّ شِبْرًا تَقَرَّبْتُ إليه ذِرَاعًا، وإذا تَقَرَّبَ إليَّ ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ مِنْهُ بَاعًا، وإذا أتاني يمشي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً

واتا: هەرکەسێک بستێک لێم نزیک بێتەوە، من باڵێک لێی نزیک دەبمەوە، هەر کەسێک باڵێک لێم نزیک بێتەوە من شا باڵێک نزیک دەبمەوە، وە هەر کەسێک بەڕۆیشتنی بۆ لام بێت من بە هەروەڵە بۆی دەڕۆم!

---

[8] [صحيح] - [حديث أنس -رضي الله عنه- رواه البخاري . حديث أبي هريرة -رضي الله عنه- متفق عليه].

**سبحان ربك رب العزة عما يصفون**

**وسلام على المرسلين والحمدلله رب العالمين**

## سەرچاوەکان:


- https://www.tandfonline.com/doi/full/10.1080/13602004.2017.1339500
- https://www.bbc.com/news/world-europe-49586759
- https://www.nsvrc.org/statistics
- https://www.peta.org/living/personal-care-fashion/carmine-makeup/
- https://scholar.google.com/scholar?cluster=9840281562693196087&hl=en&as_sdt=2005&sciodt=0,5
- http://www.bbc.co.uk/newsbeat/article/33237269/skinny-jeans-and-other-hidden-health-risks-in-your-wardrobe
- https://muslim-players.com/2020/02/19/muslim-girl-invented-smart-shoes-for-the-blind/?fbclid=IwAR37X-Qr31mTbx8viwDJpEF6MMDFCx0H0O6K4D9X20puO1fQi_VxeSEbMpQ
- https://islamtics.com/four-muslim-schools-secure-1st-and-other-3-positions-in-uks-top-10-schools-list/
- https://www.youtube.com/watch?v=1Ed663rYCGs
- https://www.google.com/amp/s/amp.cnn.com/cnn/2020/02/18/us/boy-scouts-bankruptcy/index.html
- https://www.nsvrc.org/statistics
- https://islamqa.info/en/answers/235/islamic-dress-code-for-females٣٣٣
- https://islamqa.info/en/answers/95575/her-husband-is-asking-her-to-take-off-her-hijab
- https://www.thewomens.network/blog/the-male-gaze-and-its-effects-on-women
- https://muslimskeptic.com/2023/02/07/islam-mental-health-depression/
- https://islamqa.info/en/answers/89878/the-virtue-of-adhering-to-the-sunnah-at-times-of-widespread-evil
- https://islamqa.info/en/answers/9515/why-is-hijaab-so-important-when-it-is-not-one-of-the-pillars-of-islam
- https://www.theguardian.com/technology/2020/dec/23/everyone-and-their-mum-is-on-it-onlyfans-boomed-in-popularity-during-the-pandemic
- https://www.islamweb.net/en/fatwa/81554/woman-covering-her-entire-body-face-hands-feet
- https://www.followchain.org/onlyfans-statistics/#1
- https://www.healthdigest.com/426567/when-you-wear-tight-clothing-every-day-this-is-what-happens/

- https://www.cutislaserclinics.com/blog/tight-fitting-clothes-what-can-they-do-to-your-body-and-health/
- https://www.postandcourier.com/aikenstandard/lifestyle/health-and-fitness-are-your-pants-making-you-fat/article_6e818551-9103-5836-83f0-d89ca9c2ca4f.html#:~:text=In%20fact,%20you%20could%20gain,requires%20significant%20effort%20to%20fix.
- [سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم: (2688)] .
- https://walamakan.com/860
- https://www.islamweb.net/en/article/203884/when-you-wear-your-hijab%E2%80%A6
- https://islamqa.org/hanafi/askimam/4733/1-do-women-get-rewarded-for-covering-them-selves-and-being-modest-2-can-a-person-say-that-there-is-not-a-100-guarantee-that-each-and-every-hadith-is-correct/
- https://al-miftah.com/the-hadith-which-promises-the-reward-of-100-martyrs/
- https://www.dorar.net/hadith/sharh/113665
- https://mawdoo3.com/%D8%A3%D9%86%D9%88%D8%A7%D8%B9_%D8%A7%D9%84%D8%B2%D9%86%D8%A7#cite_note-FFFvFupoDu-9
- https://sunnah.com/tirmidhi:3058
- https://islamqa.info/en/answers/27259/what-constitutes-zina#types-of-zina
- https://islamqa.info/en/answers/89878/the-virtue-of-adhering-to-the-sunnah-at-times-of-widespread-evil
- https://ar.islamway.net/micropost/9078/-%D8%A5%D9%86-%D8%A7%D9%84%D8%AD%D9%85%D8%AF-%D9%84%D9%84%D9%87-%D9%86%D8%AD%D9%85%D8%AF%D9%87-%D9%88%D9%86%D8%B3%D8%AA%D8%B9%D9%8A%D9%86%D9%87-%D9%88%D9%86%D8%B3%D8%AA%D8%BA%D9%81%D8%B1%D9%87-%D9%88%D9%86%D8%B9%D9%88%D8%B0-%D8%A8%D8%A7%D9%84%D9%84%D9%87-%D9%85%D9%86-%D8%B4%D8%B1%D9%88%D8%B1
- https://sunnah.com/tirmidhi:3058
- https://dorar.net/hadith/sharh/85602
- https://sunnah.com/ibnmajah:3606
- https://khaledalsabt.com/explanations/2971/%D8%AD%D8%AF%D9%8A%D8%AB-%D8%B5%D9%86%D9%81%D8%A7%D9%86-%D9%85%D9%86-%D8%A7%D9%87%D9%84-%D8%A7%D9%84%D9%86%D8%A7%D8%B1-%D9%84%D9%85-%D8%A7%D8%B1%D9%87%D9%85%D8%A7

- https://islamqa.info/ar/answers/182767/%D8%A7%D9%84%D9%83%D9%84%D8%A7%D9%85-%D8%B9%D9%84%D9%89-%D8%AD%D8%AF%D9%8A%D8%AB-%D8%A7%D9%84%D8%AA%D8%A7%D9%89%D8%A8-%D9%85%D9%86-%D8%A7%D9%84%D8%B0%D9%86%D8%A8-%D9%83%D9%85%D9%86-%D9%84%D8%A7-%D8%B0%D9%86%D8%A8-%D9%84%D9%87
- https://hadeethenc.com/ar/browse/hadith/6461
- کتێبی خوشکی بەڕێزم چی ڕێگریت دەکات لە بالآپۆشی؟ وەڵام دانەوەی گومان و بیانوی ئەو خوشکانەی  کە بالآپۆش نین
- کتێبی کۆسپەکانی حیجاب
- تەفسیری رامان  (قورئانی پیرۆز)
- تەفسیری ئاسان (قورئانی پیرۆز)
- تەفسیری پوخت (قورئانی پیرۆز)
- کتێبی پەیڕەوی تەوبەکاران